لە چاپکراوەکانی کۆڕی زانیاری عێراق
«دەستەی کورد»

# کۆمەڵەی شیعری
# فەقێ قادری هەمەوەند

مەلا عبدالکریمی مدرس
و
فاتح عبدالکریم

کۆیان کردووەتەوەو ڕاستیان کردووەتەوەو
فەرهەنگۆکیان بۆ ئامادە کردووە

چاپخانەی کۆڕی زانیاری عێراق
بەغدا ـ ١٩٨٠

لە چاپکراوەکانی کۆڕی زانیاری عێراق
"دەستەی کورد"

# کۆمەڵەی شیعری
# فەقێ قادری هەمەوەند

مەلا عبدالکریمی مدرس
و
فاتح عبدالکریم

کۆیان کردووەتەوەو ڕاستیان کردووەتەوەو
فەرهەنگۆکیان بۆ ئامادە کردووە

چاپخانەی کۆڕی زانیاری عێراق
بەغدا - ١٩٨٠

# پێشەکی

تیرەی هەمەوەند یەکێکە لە تیرە بەناوبانــگەکانی کورد کە لــە ڕووی ئازایەتی‌و خۆگری‌یەوە شوێنێکی تایبەتی‌و ناوێکی دیاری‌یان بووە • ئــەم تیرەیە هەروەك پیاوی سوارچاك‌و چالاك‌و نەبەزو دەمڕاستیان زۆر بووە ، بێ‌گومان پیاوی ئەدیب‌و ئەدەب‌دۆست‌و خوێندەواریشیان تیا هەڵکەوتووە• ناچێتە عەقڵەوە تیرەیەکی‌وا چاونەترساو کە بەدرێژاییی ساڵ لە بەردەڵ بەردو گێرەو کیشەی قاجاری‌و عوسمانیدا بووبن‌و ، هەیێتیکیان ئەمدیوو هەیێتیکیان ئەودیوو ، ڕۆژێك لە (بازیان)و ، دوو ڕۆژ لە (زەهاو) یا (قەسری شیرین)و ڕۆژێك دوورخراوەی (دەرنە)و (ئەطەنە) بووبن‌و ، لەگەڵ چەرخی گەردووندا لە تەپاوتلدا بووبن ، کەچی خوێندەواریان تیا هەڵنەکەوتبێت • بــەڵام ئەو بێ‌کەسی‌و بێ‌دەرەتانی‌یە کە بە هەزاران هونەرمەندی‌تری کوردی بێ سەرو شوێن پێچاوەتەوەو ونی کردوون ، ئەوانیشی هەر بەو دەردە بردووە •

ئێمە زۆر شادمانین کەوا توانیمان ئەم بەرهەمــەی فــەقێ قــادری هەمەوەندمان زیندوو کردەوەو خستمانە پێش چــاوی بەرەی ئەمــڕۆو دواڕۆژی نەتەوەکەمان‌و ، بەمە بۆ یەکەمجار ئەم لایەنە تاریکەی ئــەدەبی کوردمان کەمێك ڕوون‌کردەوە ، بەهیوای ئەوەی ببێتە یارمەتی‌دەرێ بــۆ دوای ئێمە ــ هاتوان‌و بتوانن شتێکی بەکەڵکتر بهێننە بەرهەم •

# دیوانی فەقێ قادر چۆن ئامادە کرا ؟

لە ساڵانی ١٩٥٥ ــ ١٩٦٠دا کەماڵمان لــە کەرکووك بوو . بــاوکم بەهۆی ئارەزووی کۆنیەوە لە گەڕان بەدوای کەلەپووری ئەدەبیی کۆنــی کورداو ، بەهۆی تێکەڵییەوە لەگەڵ هەندێ پیــاوی پــیری وریــای ئەدەبدۆست ، بەتایبەتی لە ڕێگای ( فەقێ رەشیدی هەمەوەند )ەوە [١] ئاشنایی لەگەڵ ژیانو بەسەرهاتو شیعری (فــەقێ قــادری هەمەوەنــد) پەیداکردو ، ناوە ناوە لێرەو لەوێ شیعری ئەم ذاتەی بەرگوێ ئەکەوتو ، ئەمە هەمووی بووە هۆی بیرکردنەوەی لە کۆکردنەوەی بەرهەمەکانی فەقێ قادرو کەوتە هەوڵدان بۆ پەیداکردنی سەرچاوەو ، لە ڕێگای هەندێ دۆستو برادەرەوە پەیدای کردن . بەڕێزان مامۆستا ئەمین چۆلەکی مامۆستــای مەعهەدی ئیسلامی لە کەرکووكو ، کاك فاتیح غەفوور هەمەوەند مامۆستای ناوەندیو ، کاك عەبدوڵلای حەیدەر عەزیزو ، کاك نەجمەددین فەتتــاحی هەمەوەندو ، خوالێخۆشبوو فەقێ ڕەشید لەمبارەوە یارمەتییــان داوەو بۆیە شایانی ڕێزلێگرتنو سوپاس کردنن .

باوکم لەو سەردەمەدا هەرچیی بەردەست کەوتووە نووسیویەتــەوە

---

(١) فەقێ ڕەشیدی کوڕی ئەحمەدی کوڕی عەزیــز . لە بــەرەی ( سێ‌تــا بەسەر ) ، پیاوێکی ئەدەبدۆستو سەر لە کەلەپوور دەرچوو بــوو . لە ژمارە ١٢٨٣ی ساڵی ٣١ی ڕۆژنــامەی (ژین)دا کە لە ١٩٥٦/٢/٩دا دەرچووە ، لە بەشی ( شــیعرو شــاعیرەکانمان )دا وتــارێك بە زمانیەوە لەبارەی فەقێ قادرەوە بلاوکراوەتەوە ، لەمەوپاش گەلێجار ئیشــارەتی بۆ ئەکەین . ئەم ذاتە لە ساڵی ١٩٧٥دا لە سلێمانی کۆچی دوایی کردووە.

بێ ئەوەی بەپێی ڕێو شوێنی توێ باسی سەرچاوە یا جیاوازیی تێکستی دەستنووسەکان . یا ئەو شتانە بکا کە لە پەراوێزەوە نووسراونەتەوە • هیچ نوسخەیەکی بە نوسخەی سەرەکی دانەناوە تا ئەوانی کە بخاتە پەراوێزەوە • خۆیشی بە هیچ جۆرە بابەتبەندی‌یەکەوە خەریك نەکردوە • خۆلاسە کارەکەی هەر ئەوەندە بووە کۆمەڵی شیعری فەقێ قادر بنووسێتەوەو بۆ خۆی هەڵیگرێو بیری لە چاپکردنو لێکۆڵینەوەو ڕاستکردنەوەی نەکردوەتەوە •

بۆیە کە لەم ساڵانەی دواییدا بیرمان لە چاپکردنی کۆمەڵە شیعرەکان کردەوە ، دیمان نابێ تەنها پشت بەو کارە پێشووەی باوکم ببەستین ، لەبەرئەوە هاتین دووبارە ناردمان بەدوای دەستنووسە کۆنەکانداو ، ئەوانەش کە ئەو دەستنووسانەیان لابوو ، پیاوانە بەدەنگمانەوە هاتن • ئێمەش خۆمان چیمان لابوو ، سەرەڕای دەستنووسەکانی باوکم ، هەموومان هێنانو کەوتینە بەراوردکردنیان • لەم کاری جاری دووهەمەماندا کە دووقۆڵی پێیەوە خەریك بووین ، پشتمان بە تێکڕای ئەم دەستنووسانە بەست :

١ ــ نوسخەی لەپێش و یەکەم کە دەستنووسی میرزا موحەممەد ڕەحیمی کوڕی کوێخا سلێمانی سماقلوویی [٢] ناوێکە کە کاتی خۆی لەگەڵ خوالێخۆشبوو فەقێ قادر لە بەندیخانەی کەرکووك پێکەوە حەپس بوون • ئەم پیاوە دیوانەکەی بۆ فەقێ قادر نووسیوەتەوە • خەتی خۆش بووە ، بەڵام ڕێنووسی بە باشی نەزانیوە ، بۆیە هەڵەی زۆری لە نووسینەکەدا هەیە • لە داوێنی زوربەی بەشەکانی ئەم نوسخەیەدا میرزا موحەممەد ڕەحیم

---

(٢) سماقلوو : سماقلووی سەروو و سماقلووی خواروو ، دوو دێن لە قەزای کۆیە . لامان مەعلووم نی‌یە ئەم میرزا موحەممەد ڕەحیمە خەڵکی کام سماقلوویەو . لەسەرچی گیراوەو ، چی لە بەندیخانەدا لەگەڵ فەقێ قادر کۆی‌کردوونەتەوە .

دەری‌خستووە کە ئەم کتێبەی بۆ ( جەنابی فەقێ قادر ) نووسیوەتەوە ، وەکوو لەمەوپاش بەرچاومان ئەکەوێ • ئەم نوسخەیە ئێستا لای باوکمە •

ئەم نوسخەیە ۲۰۸ پەڕەیەو ، هەر لاپەڕەی تێکڕا ۱٥ بەیتی تیا نووسراوەتەوە ، درێژیی هەر لاپەڕەیەکی ۳۰ سم‌و پانی‌یەکەی ۱۳ سمە • لە ساڵی ۱۲۹۷ەوە تا ۱۳۰۲ی هیجری نووسراوەتەوە •

۲ ــ نوسخەی دووهەم کە لە دوو بەرگدا نووسراوەتەوە ، دەسنووسی حەیدەری کوڕی عەزیزی کوڕی خوسرەوەی کوڕی موحەممەد هەمەوەندە [۳] ، ئەم نوسخەیە بەتەواوی پەڕپووت بووەو داڕزاوەو بەهۆی جزووبەند نەکرانیەوە لە زۆر شوێندا لێی‌فەوتاوە •

ئەم نوسخەیە ، وەك ڕوونووس‌کەرەوەکەی لە دواییی هەر بەشێکیدا کە دوایی‌یەکەی مابێت ــ نووسیویە ، لەبەر نوسخەکەی میرزا موحەممەد ڕەحیمی سماقلوویی نووسیویەتەوە کە باسمان‌کرد ، تەنها بەشی قەصیدەکانی نەبێ کە لە نوسخەکەی میرزا موحەممەددا نی‌یەو ئەویش نەینووسیوە لەبەر ئەو نوسخەیە نووسیویەتەوە • بەڵام ئەمە نابێ بە بەڵگەی ئەوە کە بە ئێجگاری بڵێین لەبەر ئەو نەینووسیوەتەوە ، چونکە هیچیان سەروبەریان دیار نی‌یە • بگرە من خۆم پشت بە بۆچوونی خۆم‌و ئاشنایەتیم لەگەڵ هەردوو نوسخەکەدا وائەزانم هەر لەبەر نوسخەکەی میرزا موحەممەد ڕەحیم نووسیویەتەوە •

لە بەرگی یەکەمی ئەم نوسخەیە ۷۲ پەڕەو لە بەرگی دووهەمی ۳۱ پەڕە ماوە • درێژیی پەڕەکانی بەرگی یەکەم ۲٦ سم‌و پانی‌یەکەی ۱۹ سم‌و ، درێژیی پەڕەکانی بەرگی دووەم ۳۰ سم‌و پانی‌یەکەی ۲۲ سمە • هەردوو بەرگەکە لە جۆرە دەفتەرێکی حیساباتی سەردەمی عوسمانیدا

(۳) ئەم موحەممەد هەمەوەندە مامی فەقێ قادر بووە .

نووسراونەتەوە • ئەم دوو بەرگە لە ساڵی ١٣٣٧ی هیجریدا نووسراونەتەوەو هیی کاك عەبدوڵڵای کوڕی حەیدەر عەزیـزن کە ئێستـا لـە کەرکووك دائەنیشێ •

٣ ــ نوسخەی سێهەم دەستنووسی کاك نەجمەددین فەتتاحی هەمەوەندە• ئەم نوسخەیە لەڕاستیدا بە نوسخەی تەواو دانانرێ چونکە بریتییە لە تەنها قەسیدەکانو هەندێکی بابەتی (جەبریو ئەشعەری)و هەندێك لە بـابەتی (درووودنامە)و هەندێك لە بابەتی (میعراجنامە)• بەڵام باشییەکەی لەوەدایە کە بەشی زۆری ئەوەی لە نوسخەکەی حەیدەر عەزیزدا فەوتـاوو نیـوە فەوتاوە ، لەم نوسخەیەدا هەیە • سەرەڕای ئەوە کە قەسیدەکان لە نوسخەکەی میرزا موحەممەد ڕەحیمدا بە هیچ جۆرێ نین • بۆیە ئەگەر ئەم نوسخەیەی کاك نەجمەددین نەبوایە ؛ ئەو قەسیدانە هەموو ئەفەوتان • ئەم نوسخەیە ، وەك کاك نەجمەددین خۆی نووسیویە ، لەبەر نوسخەکەی حەیدەر عەزیـز نووسراوەتەوە •

ئەم نوسخەیە لە دەفتەرێکی ١٥٠ پەڕەیی گەورەدا نووسراوەتەوە ، بەڵام تەنها ٢٦ پەڕەی لێ گرتوەتەوە • درێژیی هەر پەڕەیـەکی ٣٠ سـمو پانییەکەی ٢٢ سمەو هەر لاپەڕەی نزیکەی ٢٧ بەیتی تێدایە • ئەم نوسخەیە لە ساڵی ١٩٦٢و ١٩٦٧دا نووسراوەتەوەو لای کاك نەجمەددین فەتتاح (٤) خۆیەتی کە لە کەرکووك دائەنیشێ •

ئێمە مەبەستمان لە بەراوردکردنی ئەم نوسخانە ئەوە نەبوو نوسخەی ڕاست یا تێکستی ڕاست لەناو هەموویاندا هەڵبژێرین ، چونکە نوسخـەی سێهەمیان لەبەر نوسخەی دووهەمو نوسخەی دووهەمیان لەبەر نوسخـەی

---

(٤) کاك نەجمەددین فەتتاح لە نەوەی (شەریف فەرەنگیس)ە کە خزمو دۆستی فەقێ قادر بووە . لەم کۆمەڵە بەرهەمەدا پارچە شیعرێکی فەقێ قـادر هەیە کە بۆ شەریفی نووسیوە .

یەکەمیان نووسراوەتەوەو لەبەرئەمە تەنها نوسخەی یەکەم ، نوسخەکـەی میرزا موحەممەد ڕەحیم : بە سەرچاوەو بنچینە دائەنرێ • بەراوردەکەمـان بۆ ئەوە بوو کە نوسخەی یەکەم لە سەرەتای (دروودنامە)کەیەوە هەندێـکی فەوتاوە ، هەروا بەشی قەسیدەکان ــ وەك وتمان ــ لەم نوسخەیەدا هیچی دیار نی‌یە . سەرەڕای هەندێ ناتەواویی‌تر کە لێرەو لەوێ لەو نوسخەیەدا بەرچاو ئەکەون‌و لە شوێنی خۆیاندا ئیشارەتمان بۆ کردوون • ئێمە هەندێ لەو قەسیدانەمان لەبەر نوسخەکەی حەیدەر عەزیز نووسی‌یەوە کە لامان‌وایە ئەویش لەبەر نوسخەکەی میرزا موحەممەد ڕەحـیم نووسیونیەتەوە پێـش لەناوچوونیان لەو نوسخەیەدا • هەندێکیشیان تەنـانەت لەم نوسخەیەشدا نەماون یا نیوەو ناتەواون بەڵام لە نوسخەکەی کاك نەجمەددین فەتتاحـدا هەن‌و ئەویش بەپێی پێ‌لێنانی خۆی لەبەر نوسـخەکەی حەیـدەر عەزیـز نووسیونیەتەوە بەر لە پەڕپووت‌بوونیان • بۆیە ئێمە لە بەشی هەرە زۆری ئامادەکردنی ئەم کۆمەڵە بەرهەمەی فەقێ قادردا پشتمان بە نوسخەکـەی میرزا موحەممەد ڕەحیم بەستووەو بەش‌بەحاڵی هەموو ئەو بەشانەی بەتەواوی‌و بێ کەم‌و کورتی لەم نوسخەیەدا بووبن ، گوێمان بە هیچ جیاوازی‌یەك نەداوە کە لەگەڵ نوسخەکانی‌تردا هەیبێ چونـکە ئاشکرایـە ئەبـێ گۆڕیـن‌و دەسکاری‌یەکە لەو نوسخانەوە بێ ، تەنها جاروبار بۆ یەکێ لە دوو مەبەسـت باسی نوسخەکانی‌ترمان کردووە • یەکەم : لەکاتێکدا وشەیەك یا زیاتری بەیتێك لە نوسخە ئەسلی‌یەکەدا فەوتابێ‌و لە یەکێ لەم دوو نوسخەکەدا هەبێ • دووهەم : بۆ دەرخستنی ئەو ڕاستی‌یە کەوا هەندێ لەوانەی لەمەوپێـش کتێبێکیـان ڕوونـووس کردووە ، ڕێبـازی نووسینـەوەی ڕاستیـان نەگرتوەتەبەرو گەلێ‌جار دەسکاریی تێکستی خەڵکیان کردووە سا یا بـە بەهانەی ڕاست‌کردنەوەی یا بە بەهانەی مەعنالێدانـەوەوە بێ‌گوێدانـە ئەمانەتی ئەدەبی •

به هەر حـاڵ ئەبێ ئەوە بڵێـین کە بوونی ئەم سـێ نوسخەیە لـە بەردەستماندا بوو بە هۆی زیندووبوونەوەی ئەم ئەندازەی بەرهەمـەکانی خوالێخۆش‌بوو فەقێ قادری هەمەوەند . چونکە ئەوەی لە نوسخەکـەی میرزا موحەممەد ڕەحیمدا هەبوو بە ئەمانەت نووسیمانەوەو ، ئەوەش کـە لەوا نەبوو یا نەمابوو و لە نوسخەکەی حەیدەر عەزیزدا هەبوو . لەبەر ئەو نووسیمانەوەو . ئەوەش کە لە هیچ‌کامیـاندا نەبـوو و لـە نوسـخەکەی نەجمەددین فەتتاحدا هەبوو بە دەسخەتی خۆی ، ڕوونووسمان کرد • دیارە نوسخەی ئەم دوانەش جێی متمانەن چونکە وەك وتمان نوسخەی سێهـەم لەبەر نوسخەی دووهەم‌و نوسخەی دووەم لەبـەر نوسخـەی یـەکەم نووسراوەتەوە • چەند پارچەیەکی زیادەش لە نوسخەکەی کاك نەجمەددین فەتتـاحدا هەبوو بە خەتی کەسێکی‌تر نووسرابوونەوە ، ئەوانەیـان کـە لامان‌وابوو هیی فەقێ قادرن نووسیمانەوە • یـەك دوانێکیشیانمان بـە یەکجاری پشت گوێ خست چونکە نیوەو ناتەواوو پچڕ پچڕ بوون •

بۆ ناسینەوەی نوسخەکانیش تیپی (م)مان کردووە بە نیشـانە بـۆ نوسخەی یەکەم ، نوسخەی میرزا موحەممەد ڕەحیمی سماقلوویی‌و ، تیپی (ح)مان کردووە بە نیشانە بۆ نوسخەکەی حەیدەر عەزیزو ، تیپی (ن)یشمان کردووە بە نیشانە بۆ نوسخەکەی نەجمەددین فەتتاح •

---

(٥) بۆمان ساغ نەبودوە فەقێ قادر کە ئەم دوو کتێبـەی لە سـاڵی ١٢٩٧دا داناوە . کامیانی لەپێشەوە داناوە ، چونـکە تەنهـا لە (دروودنامە)کەدا نووسیویە کە لە مانگی ڕەمەزاندا تەواوی کردووە . ئێمە دروودنامەکەمان پێش‌خسـت کە لـە هەردوو نوسخـەکەی (م)و (ح)دا لەپێشـەوەیەو بابەتەکەشی لە بابەتی (میعراج‌نامە) لەپێشترە لە ڕووی ئاینەوە .

(٦) فەقێ ئەم دوو کتێبەی لە ١٣٠١دا داناوەو بە مانگ دیاری نەکردووە کە کامیانی لەپێشەوە داناوە ، لە نوسخەکەی (م)دا (جەبری‌و ئەشعەری) خراوەتە پێشەوەو لە نوسخەکەی (ح)دا (پند الحکما) خراوەتە پێشەوە. ئێمە بەگوێرەی نوسخەکەی (م) نووسیمانەوە .

ڕیزکردن و پاش و پێش‌خستنی بابەتە ئایینی‌یەکانی ئەم کۆمەڵە بەرهەمی فەقێ قادرەمان بەپێی ساڵی دانانی بابەتەکان دانا ، هەر لە ساڵی ١٢٩٧ەوە تا ساڵی ١٣٠٢ی هیجری • یەکەم و دووەم (درووودنامە)و (میعراج نامە)ن کە ساڵی ١٢٩٧ی هیجری دایناون [٥] • سێیەم کتێبی (فەضیلەتی بەنی ئادەم )ە کە ساڵی ١٣٠٠ داینـاوە • چـوارەم و پێنجـەم (جەبـری و ئەشعـەری)و (پندالحکما)ن کە لە ساڵی ١٣٠١دا دایناون [٦] • شەشەمیش ( عەقیـدەی ئیسلام )ە کە لە ساڵی ١٣٠٢دا دایناوە •

قەسیدەکانیشمان خستە دواوە ، چونکە بۆ نووسینەوەی ئەمانە تەنها پشتمان بە نوسخەکانی (ح)و (ن) بەستووە لەبەرئەوە کە لـە نوسخـەی ئەسڵدا نەبوون • ئەوەشیان کە لە نوسخەکەی (ح)دا هەبوو تەواو پەرپووت بوو • بەڵام تێکڕا بەهۆی ئەم دوو نوسخەوە شوێـن یا سـاڵی دانـانی هەندێکیاںمان زانی • هەندێکیان سـاڵی ١٣٠٣و هەندێکیان سـاڵی ١٣٠٤ دایناون • هیی‌وایشیان هەیە لە بەندیخانەی مووسڵ و بەشێکیشیان هـەر لە بەندیخانەی کەرکووك و غەزەلی‌وایش هەیە لە (مایدەشت) وتوویە • جـا لەبەر ئەوەی هەندێ لەمانە دوایی‌ترین مێژوویان پێوەیەو ، لەبەر ڕاگرتنی یەکێتیی بابەت و ، لەبەر نەزانینی ساڵی نووسینی هەندێکیشان ، هەموویانمان خستە دواوە •

شایانی وتنە نوسخەکەی (م) کە نوسخەی ئەسڵی‌یـە ، لاپـەڕەکانی ژمارەی دەستنووسی نووسەرەوە یا دەستنووسی کۆنیان پێوە نی‌یە • ئـەو ژمارانەی پێوەین تازەن و بە قەڵەم قۆپی نووسراون • بەڵام لە داوێنی هەر لاپەڕەیەکی جووتەوە وشەیەك یا دوو وشە بە دەستنووسی میرزا موحەممەد ڕەحیم خۆی نووسراوە ، ئەو وشەیە یا ئەو دوو وشەیە سەرەتای یەکەم بەیتی لاپەڕەی تاقی بەرابەرن ، خوێندەوار وەك پردەباز پێی ئەکاتە ئەوبەرەوەو ئەزانێ لاپەڕەی ئەوبەر لە جێی خۆیایەتی و نەگۆڕاوە • جا کە کتێبێك لـە

کتێبەکانی ناو کۆمەڵە بەرهەمەکە تەواو ئەبێ دیارە وشە بەردەبازەکە نامێنێو سەرلەنوێ لە کتێبی دواییدا دەست پێ ئەکاتەوە • بۆیە ڕێی تێ ئەچێ لە سەرەتادا کتێبێك لە شوێنێکیترا بووبێ غەیری شوێنی ئێستای ، وەك چۆن لە جزووبەندا هەندێ لاپەڕە کەوتووەتە شوێنیترو ئێمە بەهۆی ناسینەوەی بابەتو بەراوردی وشە بەردەبازەکانەوە گێڕامانەوە بۆ شوێنی خۆیان • ئەمەش هۆیەکیتر بوو بۆئەوە کە لە نووسینەوەی بابەتەکاندا ساڵی دانانیان بکەین بە سەنگو ترازووی ڕیزکردنیان •

کە باسی قەسیدەکان هاتە ناو ناوانەوە ، شایانە ئەم چەند خاڵە بخەینە بەرچـاو :

١ ــ وەك وتمان ئەم قەسیدانە ، کەمو زۆر ، لە نوسخەکەی (م)دا دیار نین • وەك پێشتریش وتمان ئەم نوسخەیە سەرەتاکەی فەوتاوە • سەرەتاکەش چەند لاپەڕەیەکە لە (دروودنامە) کە ئێمـە لەبـەر نوسخەکەی (ح)و (ن) نووسیمانەوە •

٢ ــ جا ئاخۆ قەسیدەکانیش بەشێك بوون لەم نوسخەیەو فەوتاون ، یا پێوەندییەکیان پێوە نییە ؟ لە نوسخەکەی (ح)دا لـە داوێـنی ئـەو قەسیدانەوە کە نیوەو ناتەواو ماون ، نەنووسراوە لـە نوسخـەکەی (م) وەرگیراون ، وەك لە پێینـی کتێبەکـانەوە نـووسراوە • تەنهـا چەنـد ڕستەیەکیوایان لەسەر نووسراوە کە ئەوە ئەگەیەنن فەقێ قادر لـەکوێ دایناون ، لە بەندیخانەی کەرکووك یا مووسڵ یا بەغدا ، یا لە مایدەشت •• تاد • لە هەندێکیشیاندا بـاسی ئەوە کراوە کە لـە ١٣٠٣دا داینـاون • ئەگونجێ (ح) وەختێ خۆی لە دوادوایی قەسیدەکاندا ڕوونی کردبێتەوە کەوا لەبەر چسەرچاوەیەك نووسیونیەتەوە ئیتر نوسـخەی (م) بـێ یـا نوسخەیەکیتر ، بەڵام وەك وتمان قەسـیدەکان لـە نوسخـەکەی (ح)دا

پەرپووتو نیوەو ناتەواونو دوادواییەکانیان نەماوە ، تا بزانین ئاخۆ لەبەر چ نوسخەیەك نووسراونەتەوە.

٣ ـ کاك نەجمەددین فەتتاحیش ئەم مەسەلەیەمان بۆ ڕووتر ناکاتەوە، ئەوە نەبێ کە ئەڵێ : ئەو قەسیدانە کە نووسیونیەتەوە لەبەر نوسخەکەی (ح) نووسیونیەتەوەو لە سەرەتای یەکێکیشیاندا کە یەکەم بەیتی ئەم بەیتەی خوارەوەیە :

**عید قوربانەن ، نەداریم قوربان**
**قوربانی بە غەیر یەك ڕۆح ڕەوان**

نووسیویەتی « در چپخانه موصل فرموده . هجری ذی‌حجة الحرام ١٣٠٤ » . ئەم قەسیدەیە لە نوسخەکەی (ح)دا فەوتاوە . دیارە کاك نەجمەددین پێش فەوتانی لەو نوسخەیەدا ، نووسیویەتەوە .

وەك وتمان هەڵئەگرێ (ح) ئەو قەسیدانەی لە نوسخەی (م) وەرگرتبێتو هەڵیش ئەگرێ لە سەرچاوەیەکی‌ترەوە وەری گرتبن . هەرچۆن بێ دیارە دوا مەنزڵی فەقێ قادر پێش نەفی‌کردنو دوورخستنەوەی خۆیو خێڵەکەی، بەندیخانەی کەرکووك بووەو میرزا موحەممەد ڕەحیمی سماقلوویی لەوێ ئەو کۆمەڵە بەرهەمەی فەقێی نووسیوەتەوەو لەوانەیە زیاتریشی نووسیبێتەوەو زیاترەکەی فەوتابێ . هەروەها دیارە فەقێ قادر وەك شاعیرێك بەر لە گیرانیشی شیعری وتوەو بۆیە ئەبێ هەر هیچ نەبێ هەندێ لەو قەسیدانەی لەو سەردەمانەدا وتبێ . بۆنموونە دیارە ئەو پارچە شیعرەی کە لە مایدەشت وتوویە بەر لە گیرانی وتوویە . لەمەوە ئەگەینە ئەوە کە لەوانەیە گەلێ شیعری‌تریشی بووبێ لەم‌چەشنەو کە گیراوە لە ماڵەوە بووبنو لە گیرەو کێشەی ژیاندا فەوتابن . دوورنییە چیرۆکە شیعرییەکانیشی کە ئێمە لە ڕیزی قەسیدەکاندا بڵاومان‌کردوونەتەوەو لە دەستووسەکەی (م)دا

نین . ئەو شیعرانەی بن کە پێش گیرانی وتووتی . بۆیە میرزا موحەممەد ڕەحیمی سسافلوویی لە حەپسخانە نەینووسیونەتەوە .

پاش نووسینەوەی تێکستی شیعرەکان فەرهەنگۆکێکمان بۆ ئەو وشانەیان ڕێکخست کە لامانوابوو تێکڕا بۆ خوێنەدەواری ئاشنا لە شێوەی شیعری گۆرانی . بەئاسانی . ڕاستناکرێنەوە . لەناو ئەم وشانەدا ئەوەی لای خۆمان ئاشکرا نەبووبێ . پشت بە فەرهەنگی فارسیو عەرەبی ڕاستمان کردوەتەوەو مەعنامان لێداوەتەوە . ئەوەش بڵێین کەوا جاروبار مەعنایواشمان نووسیو. تەنها بۆ شوێنی بەکارهێنانی وشەکە لە کتێبەکەدا دەستئەدا . واتە ئەگەر وشەکە وەك وشەی فەرهەنگی تەماشا بکەین . مەعناکەی دەق ئەوە دەرناچێ کە تێیە لە فەرهەنگۆکەکەدا نووسیومانە . بەڵام لە شوێنی بەکارهێنانیدا لەم کتێبەدا تەنها بەوجۆرە دێت کە ئێمە ڕوونمانکردووەتەوە . دیارە ئەمە ئەنجامی جۆری بەکارهێنانو مەعنا پێبەخشینی وشەیە لەلایەن فەقێ قادرەوە کە گەلێجار باری تایبەتیی هەڵکەوتی بەیتەکانو وشەکان لە بەیتەکاندا ناچاری ئەم کارەی کردووە .

ئێمە نەهاتین شیعر بە شیعر مەعنای شیعرەکان لێبدەینەوە لەبەرئەوە کە تێکڕا ئەگەر مەعنای وشەکان زانرا ، مەعنا لێدانەوەی شیعرەکان زەحمەت نابێو . لەبەرئەوەش کە بەرهەمەکە زۆر زۆرەو بەوجۆرە مەعنا لێدانەوەیە دوو سێ ئەوەندەی لێ دەرئەچوو و توانای لەچاپدانیمان نەئەما . لەگەڵ ئەوەشدا لە هەرکوێیەکدا کەموکووڕییەك یا هەڵەیەك یا لە سنووری ڕاستەقینەی ئایین لاداتێك بووبێ ، ئیشارەتمان بۆ کردوەو ڕووی ڕاستی مەسەلەکەمان دەربڕیوە .

لەلایەن ڕێنووسیشەوە بە بۆچوونی خۆمان لەبارترین ڕێنووسی کوردیی ئەمڕۆمان بەکارهێناوە ، تەنها ڕستە عەرەبییەکانمان بە عەرەبیو

سەرباسە فارسی‌یەکانمان بە فـارسی هێشتووەتەوەو بە کوردی مەعنایانمان لێداوەتەوە .

خوالێخۆش‌بوو میرزا موحەمەد ڕەحیمی سماقلوویی خەتی خۆش بووە ، بەڵام ڕێنووسی فارسی ئامێزی ئەوڕۆژەی بە باشی نەزانیوە . جـا ئەگەر لەبەر دەستنووسی فەقێ قادر شیعرەکانی نووسیبێتەوەو ڕوونووسی شێوە نووسەکەی ئەوی کردبێ ، ئەوا دیارە ئەبێ فەقێ قادریش ڕێنووسی ڕاستی نەزانیبێ . خۆ ئەگەر فەقێ بۆی خوێندبێتەوەو ئەمیش نووسیبێتیەوە، ئەوا دیارە لای کەمی ئەم ڕێنووسی ڕاسـتی نەزانیوەو فـەقێ قادریـش ـ ئـەگەر بڵێـین ڕێنووسی ڕاسـتی زانیـوە ـ لەبەر خـەم‌و پـەژارەی زۆری بەندیخـانەی تـاقەتی چـاو پیـاگێڕانـەوەی دەستنووسـەکەی میرزای نەبـوە یـا نەخـۆش‌و نـاڕەحەت‌و پەككەوتە بووەو نەیتوانیوە چـاوی پیـا بگـێڕێتەوە . ئێمە هەرچەنـد لـە پـەراوێزی تێـکستی شیعرەکانەوە هەندێجار ئیشارەتمان بۆ جۆری هەڵـەی دەستنووسـەکە کردووە . لە دوایشەوە لیستەیەکی گوشادمان بۆ زۆربـەی ئەو هەڵانـە کردووە[7]. بەڵام ئەگەر لە شوێنێکدا تێکستێکمان بۆ ڕاست نەکرابێتەوە ، بە ڕێنووسەکەی خۆی‌و وەك خۆی لەناو دوو کەوانەدا نووسیومانەتەوە .

---

(7) ئەم لیستەیە ڕاستەوخۆ لەپاش ئەم پێشەکی‌یەوە دێت .

# چەند لاپەڕەیەك لەبارەی فەقێ قادری هەمەوەندەوە

## فەقێ قــادر کێیــە ؟

فەقێ قادر خۆی لە داوێنی کتێبی ( فەضیلەتی بەنی ئــادەم )دا کــە یەکێکە لە بەشەکانی ئەم کۆمەڵــە بەرهەمەی . بەمجــۆرە خۆیمــان پێ ئەناسێنێ :

**ئەگەر مەپەرسان ئیسم موئەللیف**
**( عبدالقادر )ەن ذەلیلو ضەعیف**
**ئەصڵم ( هەماوەند ) ذەلیلو خوارم**
**مونتەظیر لوطف حەییی دادارم**

هەروەها لە پێشی کتێبی ( پند الحکما )وە ئەڵێ :

**( عبدالقادر )ەن ئیسمو ئەوصافم**
**نە زنجیرەی ذەنب قەید ئینصافم**
**ئەصڵم (هەماوەند) فیرقەی (چەلەبی)**
**داروون جە ( ڕەسووڵ جوامێر ) نەسەبی**

لە دوادوایی کتێبی ( عەقیدەی ئیسلام )یشدا ئەڵێ :

**ئیسم موئەللیف توحفەی نەوادیر**
**تەسمیەش فاشەن بە ( عبدالقادر )**
**ئەصڵم ( هەماوەند ) جاگەم ( چەمچەماڵ )**
**نە شەهر ( کەرکووك ) مەحبووسم ( الحال )**

بەپێی ئەم شیعرانەی فەقێ قادر خۆیو ، ئەو کورتە باسەی خێــڵی هەمەوەند کە لە لاپەڕەیەکی تازە نووسراوەی سەرەتــای بەرگی یــەکەمی نوسخە پەڕپووتەکەی حەیدەر عەزیزدا نــووسراوە . کە یەکــێکە لــەو

دەستووسانەی ئەم کۆمەڵە شیعرانەی فەقێیان لەبەر نووسراوەتەوە [١] ، فەقێ ناوی (عەبدولقادر)و کوڕی (ڕەسووڵ)ی [٢] کوڕی (جوامێر)ی یەکەمەو لە تایەفەی (بەگزادە)و لە فیرقەی (چەلەبی)یە . بەپێی ئەو شەجەرەیەش کە مامۆستا فاتیح غەفوور هەمەوەند بۆی ناردووین (جوامێر)یش کوڕی (یادگار)ە . لە نەوەشی ئەوەی ئێمە پێیبزانین . بەڕێز ئەنوەر ئاغای کوڕی حەمە ئەمین ئاغای کوڕیەتی [ کوڕی فەقێ قادر ] کە لە چەمچەماڵ دائەنیشێ .

## فەقێ قادر لەکوێ لەدایکبووە ؟

ڕەشید هەمەوەند لە وتارەکەی ڕۆژنامەی ژیندا [٣] ئەڵێ فەقێ قادر لە بازیان لەدایكبووە . لە چەند وەلامێکیشدا کە بەڕێزان کاك عەبدوڵلای حەیدەر عەزیزو ئەنوەر ئاغای کوڕەزای فەقێ قادر بۆیان نووسیوین بەرابەر بە چەند پرسیارێك کە لەبارەی فەقێ قادرەوە لێمان پرسیبوون ، نووسراوە « لە ناوچەی بازیان ... بەوەڵەد بووە » . بەلام لەو پەڕە کاغەزەدا کە کاك نەجمەددین فەتتاح بۆیهێناین [٤] و کورتەیەکی مێژووی ژیانی فەقێ

(١) پێشتر بە درێژی باسی ئەو دەستووسانەمان کرد .

(٢) لە لاپەڕە تازە نووسراوەکەی سەرەتای بەرگی یەکەمی نوسخەکەی (ح)دا . لەبارەی ڕەسووڵی باوکی فەقێ قادرەوە نووسراوە : «کێخوا ڕەسووڵی باوکی مەرحووم لە زەمانی سلێمان پاشاو ئەوڕەحمان پاشای بەبە لە سلێمانی کراوە بە ڕەئیس لە سالانی ١٧٨٨ی میلادیدا. دووهەم لە جیهەتی عەسکەری یەوە مەنصەبێکی بەرزی بووە ، حەتتا قشڵەی عەسکەریی لە دێی (قودرەتە) کە دێی خۆیانە لەنزیك چەمچەماڵ بۆ دروست ئەکەن. ئێستەش ئاثاری ئەو قشڵە وە بەعضێ لە حوجرەکانی مەوجوودە .

(٣) ژین . ژمارە ١٢٨٣ی ساڵی ١ .

(٤) خەریکی ئامادەکردنی ئەم کتێبە بووین کاك نەجمەددین فەتتاح پەڕە کاغەزێکی نووسراوی بۆ هێناین لەسەر باری درێژی نووشتێنرابووەوەو وەك دوو پەڕەی لێ کرابوو ، لە لایەکی ژمارەی ٢١و لە لاکەی تری ژمارەی ٢٢ی لێ نووسرابوو . وەك بڵێی دوو پەڕەی کتێبێکە . ئەم پەڕە دوولاکراوە چەند پارچە شیعرێکی فەقێ قادری تێدا نووسرابووەوە

قادریشی تیا نووسراوه ، نووسراوه « جێگای وەلادەتی ( بالضبط ) نازانرێ، چونکه نەنووسراوه . بەڵام له سلێمانی یا له (قودرەته) بەوەڵەد بووه » .

**فەقێ قادر کەی لەدایكبووەو ،**
**چەند ساڵ ژیاوه ؟**

لەبارەی ساڵی لەدایكبوونی فەقێوە ئاگاداریەکی ڕاستو ڕەوانمان بەدەستەوه نی‌یه . بەڵام له ڕێگای شیعرەکانیەوە ئەتوانین بگەینە جۆره ئەنجامێك .

فەقێ قادر له دوادوایی (میعراج‌نامه)کەیدا ئامۆژگاریی خۆی ئەکاو ئەڵێ :

**عومر عەزیزت یاوا بە پەنجا**
**تەلەف بی نە کار نوموور دنیا**

واته : تەمەنی خۆشەویستت گەیشته پەنجا ساڵو هەمووی له کاری دنیادا به فیڕۆ ڕۆیشت .

هەروا له دوایی ئەو کتێبەوه که باسی ساڵی لێبوونەوه له دانانی ئەکا ، ئەڵێ :

**تەئریخ تەئلیف میعراج خاتەم**
**سەنەی هەزار بی جه سێصەد سێ کەم**

واته : مێژووی تەواوبوونی دانانی میعراج‌نامەی پێغەمبەر ساڵی هەزارو سێصەد . سێ ساڵ کەم ، بوو که ئەکاته ١٢٩٧ . جا که ئەم دوو بەیته لێك بدەین واته بزانین فەقێ قادر له ١٢٩٧ی هیجریدا میعراج‌نامەی

---

که بەزیادەوه له دەستنووسەکانی لای خۆیشماندا هەبوون . له سووچێکیشیەوه « خلاصه‌یکی ترجمه احوالی فقی قادر هەرزنه » نووسرابووەوه . تێکستی سەرەوەمان لەبەر ئەو پارچه کاغەزه نووسیوەتەوه .

داناوەو ، لەو ساڵەدا تەمەنی ٥٠ ساڵان بووە ، دیارە ئەبێ لە ساڵی ١٢٤٧ی هیجریدا لەدایكبووبێ • خۆ ئەگەر بشڵێین بە پەنجا ساڵ گەیشتنەکەی تەمەنی لەکاتی دانانی میعراج نامەکەیدا ، شتێکی تەقریبی‌یەو دەق نی‌یە ، مافی ئەوەمان هەر بۆ ئەمێنێتەوە کە بڵێین لە دەوروبەری ١٢٤٧ی هیجریدا لەدایكبووە •

واگەیشتینە ئەوە کە فەقێ قادر یا لە ١٢٤٧ی هیجری یا لە دەوروبەری ئەو ساڵەدا لەدایكبووەو لە ١٢٩٧دا پەنجا ساڵان بووە • وەك لە دیوانە دەسنووسەکەی حەیدەر عەزیزیشەوە دەرئەکەوێ ، لە ١٣٠٢یشدا هەر لە بەندیخانە بووە ، بەڵکو لەم دەسنووسەوەو لە دەسنووسەکەی نەجمەددین فەتتاحیشەوە دەرئەکەوێ تەنانەت لە ساڵی ١٣٠٤یشدا هەر لە بەندیخانە بووە • بەم‌پێ‌یەش وا تەمەنی گەیشتە ٥٧ ساڵ • جا ئەگەر ڕاست بێ لە ساڵی ١٣٠٥دا لەگەڵ هۆزەکەی دوورخرابێتەوە بۆ شاری بنغازی [٥] لە لیبیای ئێستەو لە ساڵی ١٣٠٨دا لەوێ کۆچی دوایی کردبێ [٦] ، ئەوا تەمەنی ئەبێ بە ٦٠ — ٦١ ساڵ • بەڵام فەقێ قادر خۆی لە (فەضیلەت‌نامە)کەیدا ئەڵێ :

**(فەقێ) تۆ عومرت بە شەصت نەزدیکەن**
**هێمان ڕای حەقیق وەنەت تاریکەن**

وەك وتیشمان فەقێ قادر (فەضیلەت‌نامە)کەی لە ساڵی ١٣٠٠دا داناوەو، بەم‌پێ‌یە ئەبێ لەم ساڵەدا — کە ئەبوو بەگوێرەی لێکدانەوەکانی پێشوو تەمەنی ٥٣ ساڵ بوایە — تەمەنی لە ٦٠ ساڵان نزیك بووبێ ، واتە ٥٧ — ٥٨ ساڵان بووبێ •

بۆیە ئێمە وای بۆ ئەچین فەقێ قادر خۆیشی بەوردی نەیزانیوە لە

(٥) وتارەکەی ڕەشید هەمەوەند لە ڕۆژنامەی ژیندا کە ئیشارەتمان بۆ کرد.
(٦) شوێنی کۆچی دوایشی قسەی زۆری تیایە ، پاشان دێینەوە سەری .

چ ساڵێکدا لەدایك بووەو . کە وتی عومری گەیشتووە بە پەنجا مەبەستی ئەوە بووە لە دەوروبەری پەنجادایەو ، هەر بەم پێیە کە وتیشی عومری لە شەصتەوە نزیکە . هەر دەوروپشتی شەصتی مەبەست بووەو ، کەواتە ئەبێ لە ساڵانی ١٢٤٦ ـ ١٢٤٧دا لەدایك بوو بێ و لە ساڵانی ١٣٠٧ ـ ١٣٠٨دا کۆچی دوایی کردبێ (٧) .

## گۆشەیەکی ژیانی فەقێ قادر

فەقێ قادر لە سەردەمی سوڵتان عەبدولعەزیزی عوسمانیدا قایمقامی چەمچەماڵ و ناوچەی بازیان بووە . لە ڕووی خێڵایەتیشەوە سەرکۆماری خێڵی هەمەوەند بووە (٨) . بە نیشانەی هەندێ پارچە شیعریدا دیارە لە ناوچەی مایدەشت و زەهاو دەوروپشتیشی ژیاوە . دوور نی یە ژیانی ئەو ناوچانەی لە ساڵانی یاخی بوونی خێڵی هەمەوەندا بوو بێ لە دەوڵەتی عوسمانی .

---

(٧) لە وتارەکەی ڕۆژنامەی ژیندا کە ئیشارەتمان بۆ کرد . نووسراوە فەقێ قادر ساڵی ١٢٢١ی هیجری هاتووەتە دنیاوە . لە وەڵامە باسکراوەکانی کاك عەبدوڵڵای حەیدەر عەزیزو کاك ئەنوەر ئاغای کوڕەزای فەقێ قادریشدا نووسراوە لە ١٢٢٣ی هیجریدا لەدایك بووە . لە پەڕە کاغەزە باسکراوەکەی کاك نەجمەددین فەتتاحیشدا نووسراوە لە ١٢٤٨دا لەدایك بووە ، بەڵام ساڵەکە بە قەڵەمێکی تر گۆڕراوەو کراوە بە ١٢٤٢ . بەش بەحاڵی وتارەکەی ژین و وەڵامەکانی کاك عەبدوڵڵاو کاك ئەنوەر ، ئەوە بە هیچ جۆرێ لەگەڵ ئەو شیعرانەی فەقێ قادر خۆیدا ناگونجێن کە پێشتر گێڕامانەوەو فەقێ تەمەنی خۆیی لە کاتی وتنیاندا دیاری کردووە تیایانداو ساڵی دانانیشیان ئاشکراو دیارە . بەش بەحاڵی مێژووە دەسکاری کراوەکەی کاغەزەکەی لەمەڕ کاك نەجمەددینیش . ئەوەی لێیەوە وەرئەگیرێ ئەوەتە کە تێکڕا بۆچوونەکانی ئێمە ڕاستن و ، تەنانەت بە دەسکاری یەکەشەوە هێشتا نیشانەی هەڵەیی ئەو مێژوودیە کە لە وتارە باسکراوەکەی ژین و وەڵامەکانی کاك عەبدوڵڵاو کاك ئەنوەردا نووسراوە .

(٨) وتارەکەی ڕەشید هەمەوەند لە ڕۆژنامەی ژیندا .

## فەقێ قادر چەند ساڵ لە زینداندا بووە ؟

وەك لە دوو بەیتی (میعراجنامە)کەیەوە دەرئەکەوێ ، فەقێ قادر پێش گیرانی دواجاری کە چەند ساڵی خایاندووەو نەفیەکەی بەدوادا هاتــووە ، گەلێجار گیراوەو بەربووەو تەنانەت قسەیواش هەیە کە چەند جار هەمەوەند هاتوون بە زۆر لە بەندیخانە دەریانهێناوە [٩] . ئەو دوو بەیتــەی فــەقێ قادر ئەمــانەن :

**فەقێ تۆ بێگوش ، هەم بێضەمیریت**
**چەو سەبەب هەر بەند بەستەی زنجیریت**

گیرانی سەختو ڕاستەقینەو بێئامانی فەقێ قادر ئەو گیرانەیەتی کە لــە دوا ساڵەکانی ژیانیا بوەو لێی ڕزگار نەبوەو نیشتمانی خۆی پاش ئەو گیرانە نەدیوەتەوەو مەنزڵی پێش مەرگی بووە . بەڵام بەوردی لێمان ئاشکرا نییە ئەم گیرانەی چەند ساڵی خایاندووەو بۆ گەیشتن بەئەنجامێــك لەمڕووەوە ئەبێ بگەڕێینەوە سەر بەرهەمە شیعرەییەکانی تا چەردەیەکمان بۆ دەرکەوێ .

ئەوەی لێمان ئاشکرایە ئەوەتە فەقێ قادر (دروودنامە)و (میعراجنامە)و (فەضیلەتی بەنیئادەم)و (جەبریو ئەشعەری)و (پند الحکما)و (عەقیــدەی ئیسلام)ی لە حەپسخانەی کەرکوك داناوە یا هەر هیچ نەبێ لەوێ تەواوی کردوونو میرزا موحەممەد ڕەحیمی سماقلوویی‌ش لــەوێ نووسیونیەتەوە بۆی . هەروەها ئاشکرایە کەوا (دروودنامە)و (میعراجنامە)ی لــە ١٢٩٧و ، ( فەضیلەتی بەنی ئادەم )ی لە ١٣٠٠و ، ( جەبریو ئەشعەری )و ، ( پنــد الحکما )ی لە ١٣٠١و ، دواکتێب (عەقیدەی ئیسلام)ی لە ١٣٠٢ی هیجریدا تەواوکردووە . واتە بەپێی ئەو نوسخەیە کە مــیرزا موحەممــەد ڕەحــیم نووسیویەتەوەو بە قسەی فەقێ خۆی کە کتێبەکان لە بەردەستی خۆیــداو لە بەندیخانەی کەرکوك نووسراونەتەوە ، گومان لەوەدا نییە کە فەقێ لای

(٩) پەڕە دەستنووسە باسکراوەکەی کاك نەجمەددین فەتتاح .

کەمی لە ١٢٩٧ی هیجری‌یەوە تا جومادای یەکەمی ١٣٠٢ لە بەندیخانەی کەرکووك بووە کە ئەکاتە نزیکەی پێنج ساڵو نیو •

لە لایەکی تەشەوە فەقێ قادر لە سەرەتای کتێبی (عەقیدەی ئیسلام)دا ئەڵێ :

**چون موددەی حەپسم یاوا بە سێ ساڵ**
**لازم‌ئەرد پەیدا کەرووون ئیشتیغال**

کتێبەکەشی لە ١٣٠٢دا تەواوکردووە وەك ئەڵێ :

**مەنظوومەی کیتاب ( عەقیدەی ئیسلام)**
**( الحمد لله ) یاوا بە خیتام**
**سەنەی هەزارو هەم سێصەدو دوو**
**کەردم ئیستیخراج مەسائیل هەر سوو**

تـا ئەڵێ :

**ئەسڵم هەماوەند ، جاگەم (چەمچەماڵ)**
**نە شەهر ( کەرکووك ) مەحبووسم ( الحال )**

کەواتە وا لە ١٣٠٢دا پێنج ساڵی لە بەندیخانەدا پڕ کردەوە ، سـێ ساڵ بە دەس‌بەتاڵی‌و دوو ساڵ بە دانانی (عەقیدەی ئیسلام)ەوە •

هەروەها لەم (عەقیـدەی ئیسـلام)ەدا کـە بـاسی لێپرسینـەوەو تۆڵەسەندنەوەی ڕۆژی قیامەت ئەکاو پیشانیئـەدا کە چۆن لـەوڕۆژەدا دوژمنەکەی دێنێتە گیروگاز ، ئەڵێ :

**بەعضێشان بە خەصم ماچۆ : هەی موشیر**
**بە ناحەق سێ ساڵ منت کەرد ئەسیر**
**پەی چێش نە کارم نەکەردی تەحقیق**
**پەی شوهرەت کینێت بە مۆر کەرد تەصدیق**

ئەمەش بەڵگەیەکی‌تر کەوا فەقێ ئەم کتێبەی لەسەرەتای ساڵی ١٣٠٠دا داناوەو پاش سێ ساڵ لە گیرانی دەسی بە دانانی کردووە •

قەسیدەکانیش کە تێکڕا تەنها لە نوسخەکانی (ح)و (ن)دا هەن ، هەیانە لە ١٣٠٣ی هیجریدا لە بەندیخانەی کەرکووکو ، هەیانە لە ١٣٠٤دا لە بەندیخانەی مووسڵ وتراوە •

وا بەمەشدا دەرکەوت فەقێ قادر پاش ١٣٠٢یش واتە تا ١٣٠٣و ١٣٠٤ لە بەندیخانەی کەرکووکدا ماوەتەوەو لە ١٣٠٤دا ڕێی کەوتووەتە بەندیخانەی مووسڵ • جا یا هەر بۆ ئەوێ گوێزراوەتەوە یا لە ڕێی دوورخستنەوەکەیدا لەگەڵ خێڵەکەی لەو ماوەیەدا لەوێ گیرساوەتەوە • هەردوو بۆچوونەکە ڕێیان تێ ئەچێ •

کەواتە وا بەپێی تێکڕای دەستووسەکانی بەردەستمان ، دەرکەوت فەقێ قادر نزیکەی حەوت ساڵ لە زینداندا بووە ، بێجگە ئەوەی کە پێشتریش ناوبەناو گیراوەو خراوەتە زیندانەوە ، وەك باسمان کرد •

لە قەسیدەکانی فەقێ قادردا قەسیدەیەك هەیە لای سەرووییەوە نووسراوە «این عریضە بحضور حضرت غوث الاعظم فرستادە» • واتە : ئەم عەرزوحاڵەی بۆ حەزرەتی غەوثی مەزن داناو • بەیتێك لەم قەسیدەیەدا هەیە تیا ئەڵێ :

**یەك ساڵەن مەحبووس غەریب زێدم**

واتە : ساڵێکە بەندیمو لە نیشتمانی خۆم دوورم • بە نیشانەی ئەوەدا کە ئەم پارچە شیعرەی بۆ حەزرەتی غەوث نووسیوەو هەندێ وەصفیوای بەندیخانەکەشی تیا کردووە کە زیاتر بۆ بەندیخانەی بەغدا دەس ئەدا ، دوور نییە لەوێ دایناب • ئەگەر وابێ ئەبێ کە گیراوە بردبێتیانە بەغداو لەوێ مابێتەوە تا ئەنجامی مەحکەمەکردنو حوکمدانو پاشان گواستبێتیانەوە بۆ بەندیخانەی کەرکووکو تا دوورخستنەوەکەی لەوێ مابێو بە ڕێی دوورخستنەوەکەشیا ڕێی کەوتبێتە مووسڵ ، چونکە وەك پێشان وتمان پارچە شیعریوایشی هەیە لە ١٣٠٤دا لە بەندیخانەی مووسڵ دایناوە •

## فەقێ قـادر کەیو لەکوێ مردووە ؟

دوورخستنەوەی فەقێ قادر لە نیشتمانو مردنی لە غەریبیدا شتێـکی ئاشکراو دیارەو کەس نکوولی لێ ناکا • بەڵام بـۆکوێ دوورخراوەتەوەو لەکوێ مردووە ؟ ئەمە هێشتا ساغ نەبوەتەوە •

ڕەشید هەمەوەند لە وتارەکەی ڕۆژنامەی ژینیدا ئەڵێ : «ساڵی ١٣٠٨ی کۆچی لە شاری (بنغازی) کۆچی دوایـی کردووە » • لە لاپـەڕە تـازە نووسراوەکەی پێشی نوسخەکەی (ح)یشدا کە بە دەسنووسی کاك عەبدوڵڵای حەیدەر عەزیزی ئەزانـین نووسراوە : « ••• حوکومـەتی عوسمـانی هەموویان [ هەمەوو هەمەوەندەکان ] نـەفی دەکا بـۆ بنغـازیو غـەربی طەرابلوس •• فەقێ قادرێ ڕەحمەتی لە ضیمنی ئەوان نەفی دەکرێ ، لـە شاری (دەرنە) وەفات ئەکا لە ساڵی ١٣٠٥ • گۆڕی لەوێ مەوجوودە » • لە پەڕە کاغەزەکەی کاك نەجمەددین فەتتاحیشدا کە پێشتر چەنـد جـار باسمانکرد ، نووسراوە : «فەقێ قادر لە شاری (ئەطەنەی)ی ئەناضـۆل وەفات ئەکات » • بەڵام بە قەڵەمێـکی قۆپی خەتێك بەسەر ( ئەطەنە )کەدا هێنراوەو لە پەراوێزیدا نووسراوە : « لە شاری (دڕنە) کە قەزای لیـوای بنغازی بوو ، وەفاتی کردووە » هەروەها نووسراوە « وەفاتی ساڵی ١٣٠٧ بووە » • لە وەڵامەکانی کاك عەبدوڵڵای حەیـدەر عەزیـزو کاك ئـەنوەر ئـاغایشدا نووسراوە لە ساڵی ١٣١٠دا مردووە •

وەك لەم قسانەوە دەرئەکەوێ هێشتا بەڕاستی ساغ نەبوەتەوە فەقێ قادر کەی کۆچی دوایی کردووەو لەکوێ بە خاك سپێرراوە • لە بـابەتی دواییشدا کە باسی تیرەی هەمەوەندە ، دێینە سەر نەفیکردنی ئـەم هۆزەو لەوانەیە سەرێکیتری مەسەلەکە ڕوون بێتەوە •

## پایەی خوێندەواریو ڕۆشنبیری فەقێ قـادر

ئێمە لامانوایە فەقێ قادر خوێندنی ئایینیی تەواو نەکردووە ، واتـە

ئیجازەی دوازدە عیلمەی مەلایانەی وەرنەگرتووە وەك جاران باو بووە • بگرە نەشگەیشتووەتە پلەی (موستەعید) کە پلەی بەرزی خوێندنی مەلایانەیەو فەقێ پاش تەواوکردنی ئەو پلەیە ئەبێ بە مەلا • لەو پەڕە کاغەزەدا کە کاك نەجمەددین فەتتاح بۆی هێناین‌و باسی کورتەی ژیانی فەقێ قادری تیا نووسراوەو پێشتر ئیشارەتمان بۆ کرد، بەپێچەوانەی ڕەشید هەمەوەندەوە کە ئەڵێ « فەقێ قادر خوێندنی لە وڵاتی خۆماندا تەواو کردووە [10] » ـ نووسراوە کەوا « •• خوێنەوار بوو ، بەڵام تەحصیلی تەواو نەکردوە »• فەقێ قادر خوێندنی تەواو بکردایە ؛ بە لای زۆرەوە ڕێبازی مەلایەتیی ئەگرتەبەرو فەقێیی ڕائەگرت تا دەرسیان پێ بڵێ • ناویشی بە (فەقێ) نەئەمایەوەو پێی‌ئەوترا (مەلا قادر) • لەم دوانەش گرنگتر ناوەڕۆکی بەرهەمەکانی ئەوەندە سادە نەئەبوون کە تەنانەت گەلێ بابەتی‌وایشیان تیایە لەگەڵ ڕاستەقینەکانی ئایینی ئیسلام ناگونجێن ، وەك لە گەلێ شوێنی ئەم کتێبەدا پیشانمان داوە •

بەڵام گومانی تیا نی‌یە کەوا خوێندەوارێکی زۆر زیرەك‌و هەڵکەوتوو چاوکراوە بووە • شارەزایی‌یەکی زۆری لە بابەتە کەلەپووری‌یە ئەدەبی‌یەکانی فارس‌و کورد بوەو لەبارەی کاروباری دنیای ئەمڕۆشەوە ئاگادارو چاوکراوە بووە • ئەگەر بۆی بلوایە لەجیاتیی تێوەگلان بە کاروباری خێڵایەتی‌یەوە ؛ خوێندنی تەواو بکردایەو خەریکی شیعرو ئەدەب بوایە پایەیەکی گەلێ لەمەی ئێستای باڵاتری دەسگیر ئەبوو •

کەم نی‌یە کەسێك لەو بارو دۆخەدا کە فەقێ قادری تیا ژیاوە باسی جیایی ڕێبازی جەبری‌و ئەشعەری بکات‌و دەم لە فەلسەفە بدات ، یاخود ئەم خەیاڵە قووڵە بخاتە کارو باسی شەڕی نەفس‌و ڕۆح بکات‌و بیکا بە

---

(١٠) وتارەکەی ڕەشید هەمەوەند لە ڕۆژنامەی ژیندا کە پێشتریش باسمان‌کرد .

ڕەمز بۆ شەڕ لەنێوان ئیسلام‌و قانوونی دەسکرددا . هەرچەند بۆچوونەکەشی نوێخوازانە نی‌یە . یا باسی گەورەیی‌و پایەبەرزیی ئادەمیزاد بکات‌و ئەم هەموو نموونەکاری‌یانە دەرخات‌و ، پەندو ئامۆژگاری لە فارسی‌یەوە وەرگێڕێتە سەر کوردی‌و . زستان‌و بەهار بەگژی یەکدا بکاو ، ئەفسانە لەنێوان بازو کەو ، یا لەنێوان گوێدرێژو ڕێوی‌و شێردا بهۆنێتەوە . کە هەموو پڕن لە مانای وردو پەندی بەسوود . ئەمە هەموو سەرەڕای ئەو وەصفە جوانە ساکارانە کە لە شیعرەکانی ( سوهەیل‌نامە)و ( جەنگنامەی زستان‌و بەهار)و نامەکەی بۆ (شەریف فەرەنگیس)ی برادەریدا بەرچاو ئەکەون .

فەقێ قادر پیاوێکی وریاو زیرەک‌و خێرخواه بووەو ، لەگەڵ ئەو چەرخەدا بووە کە تیا ژیاوەو بۆ پێشەوەی ڕوانیوەو . دەورو پشت کاری تێ‌کردووەو خوێندەوارێکی وردبین بووە . بەڵام بێ‌کەس‌و بێ‌دەریش بووەو دەورو پشتی بەناحەزو دوژمن تەنراوە . لە لایەکی (میعراج‌نامە)کەیدا بەم‌جۆرە دەردی دڵی خۆی دەرئەبڕێ :

**ئەر (جوامێر) مەغروور ، ئەر برا بێ‌ڕا**
**ئەر کاک (عەبدوللا عەزیز) بێ‌تەبا**
**ئەر حاتم نەپرس ، ئەر قەوم نەشنەوا**
**ئەر ڕەعیە ڕەمزەن نە قەحط‌و غەلا**
**بێ تەوفیق حەق ، بێ یەد بەیضا**
**چێش مەیۆ جە دەست یەک فەرد تەنیا**
**یونس‌وار جە قەوم وێم تەردم فیرار**
**بیم بە قووت حووت تورک دەریابار**
**فیرار بیم جە قەوم چون بەرە جە گورگ**
**نەزانام جە گورگ بەدتەر مەبۆ تورک**

لەلایەک باسی لەخۆبایی‌بوونی جوامێر (جووکل هەمەوەند)ی بەناوبانگ ئەکا کە ماوەیەک ڕۆم‌و عەجەمی شڵەژاندبوو و لە لایەکی‌کەوە باسی بێ‌پرس‌و ڕایی‌و نەشنەوایی براو ، ناکۆکیی نێوان خزم‌و کەس‌و کار

ئەکا . لە سەرێکی کەشەوە پێی ئەڵێ کە ڕەعیەت خەریـکی جەردەیـی و ڕێ گری یەو . هۆی ئەم دەردەش ئەگێڕێتەوە ؛ نەك بۆ بەدخوویی خەڵـك وەك هەندێ کەسانی ناهوشیـارو ناحەز بـە ڕەش و ڕووت بـۆ ئـەوەی ئەگێڕنەوە ، بەڵکو بۆ ناچاری و قات و قڕی و نەبوونی و گرانی و ئەو بـارە ئابووری و سیاسی یە نالەبارەی کە کوردستانی ژێردەستی عوسمانی و قاجار لەژێر باریدا ئەیناڵاند .

بەڵێ ، ئا لە حاڵێکی ئاتەواوی وادا فەقێ قادر ئەیـەوێ خـێرخواهی بکات ، بەڵام چەپلە هەرگیز بە دەستێ لێ نادرێ و (یەدی بەیضا)ی جـادوو بەزێنی مووسا پێویستە . لەدەست خزم و کەس و کارو قەوم و هۆزی ناهوشیارو نەفام ڕائەکا ، کەچی لەولاوە خراپتری دێتە ڕێ و بەدەسـت عوسمـانیی جەندرمە مەشرەبەوە تووش ئەبێت .

هەروەها ئەم پێنج بەیتـەی خوارەوەی لە (میـعراج نامە)کەی کـە هەڵوێستی گەورە پیـاوانی سەردەمی دەوڵەتمان بۆ هەڵئەسەنگێنێ تیایدا ، نیشانەیەکی تری وریایی و زیرەکینی :

**کەس نی یەن واچۆ مەر چێشمەن گوناش**
**هەردەم بە ڕەنگێ مەدەری سزاش**
**(والی) موخەننەث ، (قوماندار) ئەحمەق**
**(شێخ عەلی) خائیف ، (دەفتەردار) سەرشەق**
**(قاضی) بەدعەمەل ، (موفتی) بێ کارە**
**(ڕوشدی بەگ) بێ ڕوشد ، (ئەرکان) پەتیارە**
**(موددعیی عومووم) ظەرفش خاڵی یەن**
**(ڕەئیس جەزا) لائوبالی یەن**
**غەیر خوداوەند فەرد فەریادڕەس**
**حەرف خەیر (أصلاً) نی یەن جە لای کەس**

سەیرکەن چۆن پارچە پارچەی کۆمەڵی کاربەدەست و پیاوماقووڵانی ئەو سەردەمەمان بۆ شی ئەکاتەوە : کەس نی یـە لـە کەسـێکی گـیرۆدە

بپرسێتەوەو . نە ئایین هەیەو نە قانوونو نە ویژدان • تەنانەت (والی) کە سەرگەورەی هەموانەو نوێنەری (بابی عالی !)یەو لەلایەن (خەلیفە)وە دانراوە کە بە واتەی وتوان (سێبەری خودایە) بەسەر زەوی‌یەوە ، هەر لەوێوە خەسینراوەو بۆئەوە نێرراوە لە کۆکردنەوەی زۆرترین ئەندازەی پارەو پوول بۆ خۆیو لە خۆی گەورەترەکان ـ زیاتر هیچ نەکات • (سەرلەشکر)یش کە ئەرکی پاراستنی ولاتی لەئەستۆدایە . کابرایەکی هیچوپووچو نەفامو ناشایستەیە • نوێنەری ئایینیش کە ئەبێ لە خوا بەولاوە لە کەسی‌تر نەترسێ . کابرایەکی ترسنۆکو لەسەر حەق نەهاتوە دەنگە • موفتییش هیچی لەبارەدا نی‌یەو . ئەرکانی سوپایش لەجیاتیی ڕێکوپێکی کابرایەکی پەتیارەو بەرەڵلایەو . موددەعیی عموومیش کە ئەبێ نوێنەری مافی گشتی بێ لە دادگاداو ئاگاداری دەس‌درێژ نەکردنی کەس بێ بۆ سەر مافی کەس ، بۆشو بێ‌مایەو دەس‌بەتاڵە• سەرۆکی دادگای تۆڵەسەندنەوەیش لە ستەمکاران . کابرایەکی کەمتەرخەمە و مەبەستی نی‌یە کێ چی لە کێ ئەکا••
جا ئەگەر دامو دەزگای دەوڵەت هەمووی لەم جۆرە کەسانە پێکهاتبێ ، ئەبێ کێ بەدەنگی ئەم خەڵکەوە بێتو بەفریایان بگات • بۆیە ناحەقی فەقێ قادر ناگرین ئەگەر بڵێ :

**غەیرز خوداوەند فەرد فەریادرەس**
**حەرف خەیر ( أصلاً ) نی‌یەن جە لای کەس**

جارێکی‌کەش هەر لە (میعراج‌نامە)کەیدا هەستی ڕاستەقینەی فەقێ قادرمان بۆ دەرئەکەوێ • ئەوەتە هێرش ئەباتە سەر ئەوانەی کە هەر بە ناو هەڵگری ئالای ئایینو لەڕاستیدا فڕیان بەسەر ئایینو ئایین‌پەروەری‌یەوە نی‌یە :

**نمك چون عولەمای ئەی وەقتو ئەیام**
**یەکسەر بە پارەی مەعاش بی‌یەن ڕام**

**لەقەب قاضی بی‌یەن بە رەئیس**
**ئیستە جە قاضی مەتەرۆ تەدریس**

پێیشی ناخۆشە ئیسلام بێ‌نازەو خوێندەواری نەماوەو قانوونی بێگانـە جێگای داب‌و نەریتی ئیسلامەتیی گرتوەتەوەو فەرمانڕەوایە :

**مەدرەسان خاڵی ، عیلم تەعطیلەن**
**ئیسلام ها جە بەند قانوون ذەلیلەن (١١)**

**(ناپریۆن) نە جای موجتەهیدانەن**
**بەند قانوونش عەدڵ دیوانەن (١٢)**

بۆ دەربڕینی نارەزاییش لە باری کۆمەڵایەتی کە هەژارانی تیا نارەحەت‌و دەوڵەمەندانی تیا خۆش‌گوزەران بوون ، ئەڵێ :

**بێ‌دینان خوڕەم ، دینداران مەحزوون (١٣)**
**تاجران مەسروور ، مسکینان زەبوون**

کە پارچە شیعری (زەمزەمەی عیدەن)یش ئەخوێنینەوە کە لە بەندیخانەی بەغداوە بۆ (شەریف فەرەنگیس)ی برادەرو هام‌فەردو خزمی نووسیوەو ، باسی گەورەیی‌و پان‌و پۆڕیی بەغدا ئەکا ، کۆمەڵێ وشەمان دێتە ڕێ کـە فەقێ قادر لەو پارچە شیعرەدا بەکاری هێناون‌و ناوی پیاوانی خـودا ، یـا ناوی زانست‌و هونەر ، یا ناوی ئامێرو شت‌ومەك ، یا ناوی ئەدیب‌و شاعیری بەناوبانگن • فەقێ قادر لەم پارچە شیعرەدا ئەڵێ :

---

(١١) ئیشارەتە بۆ ئەوە کە لەو سەردەمەدا هەندێ بەندی قانوونی دانراوی ئەورووپاو بەتایبەتی هیی فەرەنسە وردە وردە ئەکەوتە ناو (مەجەللە)وە، کە لە دادگاکانی عوسمانیدا حوکمی پێ ئەدرا .

(١٢) ناپریۆن : ناپلیۆن - سەرکردەی ناوداری فەرەنسە . ئەم جۆرە بـیرو باوەڕانە کە فەقێ دەریان‌ئەبڕێ • شێوەی سەرەتایی‌و کاڵ‌و کرچـی نیشتمان‌پەروەری‌و قایل نەبوون بە دەسەڵاتی بێگانەن - لـە قۆنـاغی یەکەمی سەرهەڵدانیدا .

(١٣) ئەوەمان لەبیربێ کە لەناو کۆمەڵگا سەرەتایی‌یەکانـدا تێـکرا دینـداری پیشـەی هەژاران‌و بێ‌دینی ڕەوشتی دەسەڵاتدارانە .

(کاظم)و (ئەعظەم) ، (حەبیب)و (بیشر)ەن
(بەهلوول)و (جونەید) ، (ذوالنون)ی میصرەن

یـا ئەڵێ :

قەوسەن ، نیشابەن ، قەصدەن ، قیصاصەن
رائیحەی ڕەوحەن ، ڕەقصو ڕەققاصەن
نەفیو مەنسووبەن ، یەئسو ئومێدەن
های حەسرەت بەوکەس نەیجا بەعیدەن

یـا ئەڵێ :

(تورک)و (قەجەر)ەن ، (پرووسیا)و (ڕووس)ەن
(ئەفغان)و (ئینگلیز) ، (هیندی)و (مەجووس)ەن
(نەمسا)و (فەرەنگسا)و (بوخارا)و (طووس)ەن
(یەنگی دنیا)و (چین) ، (زەنگی)و (جینووس)ەن

یـا ئەڵێ :

ئیحضارو ، ئیشراق ، فەقرو ، کیمیا
جەفرو ، جەفرو ، ڕەمل ، نەجمو ، سیمیا
تەفسیرو ، حیکمەت ، وەضع وەحیدەن
های حەسرەت بەوکەس نەیجا بەعیدەن

یـا ئەڵێ :

قوففەو پاپۆڕەن ، گەشتیو پەلکانەن
جیسر تەن مائیل ، شەطط هیجرانەن

یـا ئەڵێ :

مەششافان دەور ، عوششاق جانی
(ئەنوەری)و (حافظ) ، (سەعدی)و (خاقانی)
(نازەر)و (ئەرژەنگ) ، (شاپوور)و (مانی)
مەولانا (صائیب) ، (شەمس)و (خاقانی)
(نیظامی)و (کەلیم) ، (جامی)و قەصیدەن
های حەسرەت بەوکەس نەی جا بەعیدەن

هەروەها لە (سوهەیل‌نامە)و ( جەنگ‌نامەی زستانو بەهار )یدا گەلێ تەشبیهـ‌کاریی جوانی بەکارهێناوەو سیاسەتی تێکەڵ بە خووڕەوشتی سروشت

کردووە ، ناوی بەشی زۆری ئەو دەوڵەتانەی هێناوە کە لەو کاتەدا بەناوبانگ بوونو دەری خستووە کامیان زەبەردەستو کامیان ژێردەست بووە • لە پایانی شەڕەکەی زستانو بەهاریشدا وەك شاعیرێکی دووربینو دەروون گوشاد سەرکەوتنی بە بەهار داوە •

## هەستی نەتەوەیی‌یەتی لای فەقێ قـادر

ئێمە لامانوایە تێکڕا هەر شاعیرو ئەدیـبو ئەدەبدوستێکی کـورد پێش سەردەمی بڵاوبوونەوەی هەسـتی نەتەوەیی‌یـەتی لەنـاو کوردا • شیعری بە کوردی وتبێو ، بەڵکو هەر مەلایەکی کورد کە پێش ئەو سەردەمە بەرهەمی ئایینیی بە زمـانی کوردی نووسیبێ ، نەتەوەدۆستیو ئـارەزووی خزمەت‌کردنی نەتەوە ئەو سەودایەی خستووەتە مێشکەوە • فەقێ قادریش ئەگەر تەنها لە دەلاقەی ژیانی کۆمەڵایەتیی خـۆیو خێڵەکەیـەوە بـۆی بڕوانین ، ئەبێ بیخەینە ناو ئەم چوارچێوەیەو دان بە بوونی ئەم هەسـتە لە دڵیدا بنێین • خۆ ئەگەر بێتوو وردترو دوورتر بڕوانین ، ناتوانین لە بـارو دۆخی سەردەمی بابانەکانو پێوەندی هەمەوەنـد بە بابانەکانـەوەو ، لـە بڵاوبوونەوەی دەنگ‌وباسی بزووتنە ئازادی‌خوازکانی گەلانی عوسمـانیو دەنگ‌دانەوەی سیاسەتی ئەو چەرخـەی لە کوردستـانی خـواروودا ــ جیابکەینەوە • بەشداری‌کردنی هەمەوەندەکانیش ، لەوەپاش ، لە شەڕەکانی شێخ مەحموودا لەدژی ئینگلیز کە هەموو شارەزایەکی مێژووی ناوچەکە ئاگای لێیەتی ، نیشانەی بوونی ئەو دەنگدانەوەیەیە نەك تەنهـا لـە دڵی خوێندەوارێکی وەك فەقێ قادر ، بەڵکو لە دەروونی سەرانسەری خێـڵی هەمەوەندا • کەواتە فەقێ قادر جیاناکرێتەوە لەو بارو دۆخە کۆمەڵایەتیو بیری‌یەی (نالی)و (سالم)و (حاجی قادری کۆیی)ی تیا خولقاو ، بەرهـەمی هەمان زرووفە کە ئەو شاعیرانەو گەلێ شاعیری‌تری قوتابخانەکەی ئەوانـی هێنایە بەرهەم •

هەرچەند بەرهەمەکانی فەقێ قادر تێکڕا بەرهەمی ئایینیو کۆمەڵایەتیو ڕازخوانیی ـ بە مەبەستی پەندو عیبرەت وەرگرتن لە ڕۆژگارن ، لەملاو لەولای ئەو بەرهەمانەوە جۆرە نیشانەیەکی هەستی نەتەوەیی‌یەتیو نەتەوەپەروەری دەرئەکەوێو ئێمەش هەوڵ‌ئەدەین لەم سەرەتایەدا ئەو نموونانە بخەینەڕوو :

لە کتێبی (پند الحکما)کەیدا کە باسی وەرگێڕانی کتێبەکە ئەکات لە فارسی‌یەوە بۆ کوردی ، ئەڵێ :

**چون فارسی بی ( پەند حەکیمان )**
**بە لەفظ کوردی کەردم تەرجومان**
**سا چون من ئەصڵم صینف ئەکرادەن**
**هەرکەس بە ئەمثال ویش خاطرشادەن**

واتە : لەبەرئەوەی (پەندی حەکیمان) ئەسڵەکەی فارسی بوو ، من گۆڕیمە سەر کوردی ، چونکە من خۆم ئەسڵم کوردەو هەمووکەسێکیش بە هاوچەشنی خۆیو پەندی هاوچەشنی خۆی شادمانو دڵخۆشە . بەمجۆرە فەقێ قادر بە شێوەیەکی سادەو ئاشکرا ڕوونی‌کردوەتەوە کە بۆچی کتێبەکەی لە فارسی‌یەوە وەرگێڕاوەتە سەر کوردیو . هەقی داوە بە هەمووکەس بە بەرهەمی هاوچەشنو هاوزمانی خۆی شاد بێ .

هەروەها لە میعراج‌نامەکەیدا ئەڵێ :

**هەرچەند بێ‌حەددەن سیەر نەبی**
**هەم بە فارسی هەم بە عەرەبی**
**جاهیلان کورد بێ‌حەددو حیساب**
**نمەکەن تەفهیم فارسی کیتاب**

تا ئەڵێ :

**کتێشانم تەصدیع پەرێ هامدەمان**
**کەردم تەرجەمە بە لەفظ گۆران**

که له کتێبی (دروودنامە)کەیشیدا باسی ئەوە ئەکات کە خوالێخۆش بوو کاك ئەحمەدی شێخ لە خوا پاڕانەوەی حەزرەتی خضری لە (مەکتووبات)ەکەیدا کردووە بە فارسی ، ئەڵێ :

**ئەو بە فارسی هەفتاد ئیستیغفار**
**تەرجەمەش کەردەن پەی تەسهیل کار**

تا ئەڵێ :

**من هەم تەرجەمەی ئەو پیر کامیل**
**بە لەفظ گۆران کەردەنم تەکمیل**

وەك لە گەلێ لای بەرهەمەکانیەوە دەرئەکەوێ ، فەقێ قادر ڕقێکی خەستی لە عوسمانی یەکان بووە ، هەرچەند ئەو بە ناوی (تورك) ناویان ئەهێنێ ، بەڵام مەبەستی ئەوانە ، چونکە فەقێ قادر موسوڵمانێکی ڕاستەو پاك بووەو لە ئیسلامەتیدا ڕقی نەتەوەیەك لە نەتەوەیەك بە هیچ جۆرێ نی یەو ڕەوا نی یە ، ڕق ئەبێ لە زاڵم و ستەمکارو کاربەدەستانی لە خوا نەترس بێ ، ئەنجا فەقێ قادر ئازارو جەزرەبەی لەسەر دەستی حوکمڕانە عوسمانی یەکانا چەشتووە نەك لەسەر دەستی خەڵکی ڕەش و ڕووتی تورکا کە لە وڵاتی خۆیانا ژیاون و بە دەردو ئازاری خۆیانەوە تلاونەتەوە .

بەڵام بە بۆچوونی ئێمە ڕقەکەی فەقێ قادر تەنها ڕقی ئەوە نەبوە کە زەلامێکی دیل بوەو دیلکەرەکانی عوسمانی بوون ، فەقێ قادری بەندی کە قسە ئەکا ، وەك تاقە کەسێك قسە ناکا ، وەك (کورد) قسە ئەکا ، واتە ڕقەکەی عوسمانی لە گەلەکەیەتی ، دیارە ئەمەی لە تەجرەبەو تاقی کردنەوەی ساڵانی خۆی و خێڵەکەی و گەلەکەیەوە بۆ دەرکەوتووەو مێژوو پڕە لە نیشانەی ئەوە کە عوسمانی یەکان چیان بە کوردو میرنشینی یەکانی کورد کردووەو ، چۆن چەند جار بەگژی یەکیاندا داون و چەند جار لەگەڵ عەجەم دەستیان لەدژیان تێکەڵ کردووەو هیچ گوێیان بەوە نەداوە کە هیچ نەبێ

ئەمانیش موسوڵمانن وەك ئەوان خۆیان ئیددیعای موسوڵمانەتی ئەکەن . بۆیە ئەوەتە لە (میعراجنامە)کەیدا سەرزەنشتی خۆی ئەکا کە پێیان هەڵخەڵەتاو . داوا لە خەڵك ئەکا ئەوانیش وەك ئەم پێیان هەڵنەخەڵەتێن :

**بە داموو تەزویر ، بە حیلەو بە فەن**
**ها کەفتی نە دام تورك ئەهرەمەن**
**هەرکەس بە تورکان بکەرۆ باوەڕ**
**ئەحمەق ئەوکەسەن جە من ئەحمەقتەر**

هەروەها هەر لەم کتێبەدا ئەڵێ :

**هەم کورد چەنی تورك بنیرۆ ئولفەت**
**نەقیبەت وێنەی من مەمانۆ خەجڵەت**

تا پاشان هەر لەمکتێبەدا لە باسی سەرگوزەشتەی کەوو بازدا بەراوردی پێوەندی کوردو تورك بە هیی کەوو باز ئەکاو ئەڵێ :

**چون کەبکەو بازەن ئونس کوردو تورك**
**هەر تێ جە سایەی تورکان بی بزورگ**
**مەعلوومەن جە لای عارفان کار**
**دۆستیی تورکەو کورد نیەن پایەدار**

**فەقێ قادرو سۆفیەتی**

لە هەندێ سووچی بەرهەمەکانی فەقێ قادردا دەرئەکەوێ پێوەندێکی گیانیی بەهێزی لەگەڵ خوالێخۆشبوو کاك ئەحمەدی شێخ [١٤] بووەو زۆری خۆشویستووەو یەکێك بووە لە مریدەکانیو بە شێخی سەردەمی زانیوە . ئەمە چەند نموونەیەکی ئەو شیعرانە کە ئەم لایەنانەمان بۆ ڕوونئەکەنەوە . لە (دروودنامە)کەیدا ئەڵێ :

**کاك ئەحمەدی شێخ ئەو قوطب جیهان**
**تەبلیغش کەردەن بە موعتەقیدان**

---

(١٤) لە ١٢٠٨ی هیجریدا لەدایکبووەو لە ١٣٠٥دا کۆچی دوایی کردووە . ئارامگای لە یەکێ لە ژوورەکانی مزگەوتی گەورەیە لە سولەیمانی .

هەروەها لە (فەضیلەتی بەنی ئادەم )ەکەیدا ئەڵێ :

**هەم پەی کاك ئەحمەد ڕەوان کەر هانا**
**هەم دوعاش قەبووڵ . هەم ڕەجاش بەرجا**
**قوطب زەمانەن ئەو پیر کامیل**
**سەیید عەصرەن عالمو فاضیل**

هەروەها ئەڵێ :

**جەنب مەلەکی چون کەردی بەیان**
**جوملە مەوجوودەن جەو قوطب زەمان**

**یەعنی شێخ ئەحمەد نۆدیهی لەقەب**
**عالیمو عامیل بەرزنجی نەسەب**

هەروەها ئەڵێ :

**مورشید ڕەشید ، قوطب ئەقطابەن**
**ئەحمەد نیشانەن ، نۆدێ ئەلقابەن**
**سەیید عەصرەن ، ڕەجول ئەمجادەن**
**خەدەمەی دەرگاش قوطبو ئەوتادەن**

تێکڕاش لەم بەرهەمەدا شیعریوا زۆرە کە بەشانازییەوە ناوی ئەولیاکانی خوا ئەباو ، بەتایبەتی لە نامەکەیدا بۆ شەریف فەرەنگیس کە پێشتر ئیشارەتمان بۆ کرد ، ناوی گەلێ لەو ئەولیایانە دێنێ کە ئارامگایان لە بەغدایە .

**نازناوی شیعریی فەقێ قادر**

فەقێ قادر لە بەرهەمەکانیدا ، چ کتێبەکانیو چ قەسیدەکانی ، وشەی ( فەقێ )ی کردووە بە نازناوی خۆی . جاروباریش (فەقێ دڵ) بەرچاو ئەکەوێ بەجۆرێ ئەگەر (دڵ)ەکە وەك پاشگر لێ نەکەین بۆ (فەقێ)کە ، مەعنای نابێ لە ڕستەکەدا . جاروباریش هەرچەند (فەقێ دڵ) هەیە ، بەڵام ئەتوانێ تەنها (فەقێ)کە بکەین بە نازناوو بڵێین (دڵ)ەکە بۆ گەیاندنی مەبەست

هێنراوه ▪ کەواتە ئەبێ لەمشوێنانەدا جۆرە یارییەکی بە وشـە کردبێو (دڵ)ی بۆ دوو مەبەست بەکارهێنابێ ▪

شوێنیوایش هەیە (دەروێش)ی تیا کردوە ▪ بە نازناو بۆ خۆی ▪ پێشتریش وتمان فەقێ قادر (دەروێش)ی کاکە ئەحمەدی شێخ بووە ▪ شایانی وتنـە لە پەڕە کاغەزەکەشدا کە کاکە نەجمەددین فەتتاح بۆی هێنـاین نووسراوە «لە گەلێ جێگادا تەخەللوصی خۆی (فەقێ)و لە بەعضێ جێگادا (دەروێش)ی وتووە » ▪

## مەبەستە شیعرییەکانی فەقێ قـادر

مەبەستە شیعرییەکانی فەقێ قادر ئەمانەن :

١ ــ ئایینو فێرکردنی ئایین ، وەکە لە کتێبەکانی (عەقیـدەی ئیسـلام)و (دروودنامە)و (میعراجنامە)و (فەضیلەتی بەنیئادەم)دا ▪

٢ ــ ئامۆژگاری ، وەکە لە کتێبی ( پند الحکما )دا ▪

٣ ــ وەصفی سروشت ، زستانو بەهارو ، جوانیی دڵدار ▪

٤ ــ سکاڵا لە دەست ڕۆژگار ▪

٥ ــ پیاهەڵدان ، وەکە پیاهەڵدانی شاری بەغدا لە پارچە شیعرەکەیدا بـۆ شەریف فەرەنگیس ، یا هیی خزمو برادەر ، یا هیی گەورە گەوران وەکە ئەوەی حسێن قولی خانی والی ▪

٦ ــ لاواندنەوە ، وەکە لاواندنەوەکەی کوێخا سلێمانی برای ▪

# ئاخۆ فەقێ قادر (سەماو زەمین)ێکیشی هەیە ؟

ڕەشید هەمەوەند لە وتارە باسکراوەکەی ڕۆژنامەی ژینیـــدا ئەڵێ : فەقێ قادر « بێجگە لە دیوانی شیعری کە هێشتا چاپ‌نەکراوە ، کتێبێـــکی شیعری بە ناوی (سەماو زەمین) داناوە کە یەکێکی‌تر داگیری کردووەو بـــە ناوی خۆیەوە چاپی‌کردووە » [1] .

ڕەشید هەمەوەند نەیوتووە کێیە ئەوەی سەماو زەمینی فەقێ قـــادری داگیرکردووەو بە ناوی خۆیەوە لەچاپی‌داوە . بەڵام ئەوەی لای هەمـــوان دیاری‌یە ئەوەیە کۆنترین چاپی سەماو زەمین ئەوەیە عەونی ئەفەندی مدیری ناحیەی باڵەك لە ساڵی ١٩٢٨دا لە چاپخانەی (زاری کرمانجی) لە ڕەواندز چاپی‌کردووەو [2] ، بە شێوەی کرمانجیی خوارووەو ، وای لەقەڵەم‌داوە کە خۆی داینا‌وە .

ئەو سەرچاوە دەستنووسانەی بەرهەمی فەقێ قادر کە لای ئێمە بوون،

---

(١) ژین ، ژمارە ١٢٨٣ی ساڵی ١ .

(٢) نەریمان «مستەفا سەیید ئەحمـەد» ، بیلیۆگرافیـای کتێبـی کوردی ١٧٨٧ ـ ١٩٧٥ ، ل ٢٤ ، بەغدا ، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کـورد ، ١٩٧٥ . ئەم کتێبە بۆ جاری دووهەمیش لە چاپخانەی (العربیە)ی بەغدا لە ١٩٣٦دا لەچاپ‌دراوەتەوە [ سەرچاوەی پێشوو ل ٤٥ ] .

مامۆستا گیوی موکریانییش پاشان ئەم کتێبەی لەچاپ‌داوەتەوەو بـە چاپی دووهەمی داناوەو ، بەپێی ئەوە کە لە باوکمی بیستووە کە وتوویـە « هیی میرزا ئەبولقاسم [ میرزا ئەبولقاسمی پاوەیی ] یا هیی مرادوەیسی [ مەلکەی مرادوەیسی ]یەو واش‌بزانم هەر هیی میرزا ئەبولقاسمە » ، بـە هیی ئەوی داناوەو ناوی عەونی باڵەکیی لێ هەڵگرتووە .

هیچ‌کامیان (سەماو زەمین)یان تیا نەبوو • ئەو دۆستو برادەرانەش کە لەبارەی بەرهەمی فەقێ قادرەوە بە دەمیو بە نووسین پێوەندمان لەگەڵیان بوو هیچ‌کامیان لەم‌بابەتەوە نە هیچیان لا درکاندووین‌و نە هیچیان بۆ نووسیوین • بۆیە لەم کۆمەڵە شیعرانەی فەقێ قادردا بەرهەمێکی بەم‌ناوە نی‌یە • بەڵام پاش لێ‌بوونەوە لە چاپ‌کردنی ئەسڵی شیعرەکان‌و بەر لە نووسینەوەی دواجاری ئەم سەرەتایە ، دۆستی خۆشەویستمان دە عیززەددین مستەفا بە ڕێکەوت لێی‌پرسین ئاخۆ لەبارەی سەماو زەمینی فەقێ قادرەوە هیچ ئاگاداری‌یەکمان هەیە • دیارە ئێمەش بە ( نا ) وەڵاممان دایەوە ، چونکە لە چەند دێڕە نووسراوەکەی لای سەرەوەی ڕەشید هەمەوەند بەولاوە هیچمان لا نەبوو • بەڵام ئەو مەعلووماتێکی لەم‌ڕووەوە لابوو • بۆیە داوامان لێ‌کرد لە ڕێگای ئەم کتێبەوە بیخاتە بەردەستی خوێندەواران • ئەویش چەند لاپەڕەیەکی بۆ نووسین کەوا لێرەدا پوختەیەکی ئەنووسینەوە • دە عیززەددین ئەڵێ :

« لە ساڵی ١٩٤٦دا مامۆستا گیوی موکریانی هاتبوە سلێمانی ، وێنەی شاعیرانی ئەگرت‌و ژیانیانی ئەنووسی‌یەوەو نموونەی شیعریانی وەرئەگرت• ڕۆژێکیان لە ماڵی ئێمە بوو ، لەگەڵ باوکم [مەلا مستەفا سەفوەتی حاجی مەلا ڕەسووڵ ]و مەحموود فەهمی ئەفەندیی فەقێ محەمەدی هەمەوەند دانیشتبوون •

« مەحموود ئەفەندی کچەزای فەقێ قادر بوو • ئاگاداری‌یەکی باشی لە ژیان‌و بەرهەمی فەقێ قادر هەبوو ، هەندێ زانیاریی لەبارەی باپیریەوە دا بە مامۆستا گیو • یەکێ لەو قسانەی لەو دانیشتنەدا کران باسی ( سەماو زەمین )ەکەی فەقێ قادر بوو • مامۆستا گیو لە مەحموود ئەفەندیی پرسی : بیستوومە فەقێ قادر سەماو زەمینێکی نووسیوە • ئاخۆ ئەو سەماو زەمینە هەر ئەوەیە کە بە ناوی عەونی ئەفەندیی مودیری ناحیەی باڵەکەوە چاپ‌کراوە،

یا یەکێکی‌تر. ؟ مەحموود ئەفەندی زۆر بە دڵگیری‌یەوە وەڵامی دایەوە : بەڵێ هەر ئەوەیەو عەونی چاپی کردووەو کردوویە بە هیی خۆی » .

دە عیزەددین پاشان ئەڵێ :

« ئێستا کە سەیری ئەو بەرهەمە ( واتە سەماو زەمینەکە ) ئەکەم ، تەواو لەگەڵ قسەکانی مەحموود ئەفەندیم ، چونکە بێجگە لەوە کە باوەڕی تەواوم بە زانین‌و ڕاستگۆیی هەیە ، بەرهەمەکە خۆیشی دیارە» . جا دێ بەراوردێ لەنێوان تێکستی شیعرە ڕێك‌وپێکەکانی کتێبەکەو سێ بەیتی دوایی‌یدا ئەکا کە دیارە عەونی ئەفەندی خۆی دایناون‌و ناتەواویی هونەری‌یان بەئاشکرا پێوە دیارەو ، ئەو مەسەلەیە دێنێتە ئاراوە کە ئاخۆ فەقێ قادر ــ کە تێکڕای شیعری پێ‌زانراوی بە دیالێکتی (گۆرانی)یە ــ کتێبەکەی بە زمانی ئەدەبیی ئەمڕۆمان داناوە ، یا کەسێك لە گۆرانی‌یەوە وەری‌گێڕاوەو عەونی ئەفەندییش ئەو سێ بەیتەی دوایی خستووەتە سەری .

لە لێکۆڵینەوەی بوون‌و نەبوونی سەماو زەمینی فەقێ قادردا گەیشتبووینە ئەم ئاستە ، دۆستی بەڕێزمان مامۆستا نەریمان دەسنووسێکی کۆنی بۆ هێناین کە کۆمەڵێ بەرهەمی (خەلیل مونەووەر)ی [٣] شاعیری تیا نووسرابووەوەو ، لە ڕیزی ئەوانەدا (سەماو زەمین)ێکیشی تیابوو شاعیرێکی نازناو ــ (فەقێ) بە دیالێکتی گۆرانی داینـاوە .

ئەم سەماو زەمینە بەم‌جۆرە دەست‌پێ‌ئەکا :

**یاران زەمینەن ..**
**سەیر گفتوگۆی سەماو زەمینەن**
**موقەددیمەی طەرح بەزم ڕەنگینەن**
**مەعرەکەی مەصاف سەماو زەمینەن**

---

(٣) مامۆستا نەریمان خەریکی ئامادەکردنی کتێبێکە بە ناوی ( خەلیل مونەووەر شاعیری چەوساوەکان ) کۆمەڵەی شیعرەکانی‌و مێژووی ژیانی تیا ئەبێ .

بەحث فەضیلەت بەین ویشانەن
نمەز تا ئاخر حەق وە کێشانەن

دوایی‌یەکەشی بەم‌جۆرە دێ :

( فەقێ ) وە سەرگەرد ئەبرۆی طاقش بۆ
فیدای گەرد سم پای بوراقش بۆ
هەرچەند عیصیانم جە حەد بەرشی‌یەن
دەفتەر گونام حیسابش نی‌یەن
شووم بێ‌عەمەل هەم بێ‌طاعەتم
مەبۆ سەعی کەی جە شەفاعەتم
ئومێدم بە تۆن ( یا رسول اللە )
مەئیووسم نەکەی تو ذات ( اللە )

ئەم چەند بەیتەی دوایی لە تێکستەکەی عەونی باڵەکیدا نی‌یە ، بەڵام بە بەراوردی ئەسڵی بابەت‌و تەئانەت داڕشتنی هەردوو تێکستەکەدا بەئاشکرا دەرئەکەوێ ئەوەی عەونی هەر ئەمەی ئەم (فەقێ)یەیە لەلایەن شاعیرێکی بەدەسەڵاتەوە کراوە بە کرمانجیی خواروو .

ئەمێنێتە ئەوە بەچیدا بزانین ئەم (فەقێ)یە فەقێ قادرەو کەسێـــکی‌تر نی‌یە . بەڵگەمان بۆ چەسپاندنی ئەمە یەکەم ئەوەیە لە چەند سەرچــاوەوە زانراوە کە فەقێ قادر (سەماو زەمین)ی هەیەو ئەمەش سەماو زەمینەو تیــا نووسراوە هیی (فەقێ)یەو کەواتە ئەم فەقێ‌یە فەقێ قادرە . دووهەم ئەوە کە فەقێ قادر گەلێ کتێبی‌تری لە بابەتی سەماو زەمینی هەیە . سێهەمیش ئەوە کە شاعیرێکی ناسراوی‌ترمان بە نازناوی (فەقێ)وە نی‌یــە .

بۆیە ئێمە ئەگەر لە چاپی ئەسڵی کتێبەکەمــان نەبووبووینایــەتەوەو مامۆستا نەریمانیش بڕیاری لەچاپدانی ئەم سەماو زەمینەی فەقێ قــادری لەلایــەنی خۆیەوە نەدایــە ، لەنــاو ئــەم کۆمەڵــە بەرهەمــەی فەقێــدا بڵاومانئەکردەوە . هەرچۆن بێ وا بۆمان ساغ‌بووەوە کە فــەقێ قــادر (سەماو زەمین)ێکی هەیەو ، ئەگەر پاشان مامۆستا نەریمان بڵاوی‌نەکردەوە، خۆمان لە دەرفەتێکدا بڵاوی ئەکەینەوەو ناهێڵین بفەوتێ .

